# پڕۆژە

## هەبوونی پڕۆژە چۆنییە؟

بۆیی کە پڕۆژەیەکت هەبێ، بە خێرایی ڕەشنووسێک بۆ خۆت بنووسە، بۆ وێنا بۆ بەرچاوڕوونی خۆت، وەک:

* مەبەستی پڕۆژەکە چییە؟

تۆ کاتێک قەولە پڕۆژەت هەبێ و بتەوێ بڵاوییبکەیتەوە، دەبێ پێش هەموو شتێکی دیکە، بیرت لایی ئەوە بێت کە تۆ چیی کارەیی بۆ چی مەبەستێک کار دەکەیی، ئاخۆ تۆ چیت دەستدەکەوێ یان چیت ئەوێ کە بیبەخشی.

* ناوی چی بێ و چۆن ناو هەڵبژێرین؟

کاتێکیش تێگەیشتیت لەوەیی مەبەستەکەت چییە و بڕیاریشت دا لەوەیی کە کاریی بۆ بکەیت، دەبێت یەکەم و سەرەتایی کارت ئەوەبێ، ناوێکی گونجاو و بە پێزی بۆ بدۆزیتەوە، ناونایش وەک ڕایی خۆم دەبێ ناو بێت، دەبێ بە جۆرێک بێت، کە خەڵکانی دیکە بخاتە نێو سەرنج، سەرنجیان ڕابکێشێت بە جۆرێک کە ناوەکەیان بە گوێدا وترا و بە چاویان بینیان، لە هەزریان بمێنێتەوە، لە لێویان ئاسان بوترێ، خۆشیش لەبەر بکرێ.

* دروشمی چی بێ و چۆن خۆیی بڵاوبکاتەوە؟
هەر ئەوەیی قەناعەتت لەسەر ناوی پڕۆژەکەت ـدا، وەک کاریی دوو لە دروشمی بڕوانە، دروشمێک بۆ مەبەستەکەت هەڵبژێرە، دروشم دەبێ ئاسان بێ دانانی، لە کاتێکدا تۆ مەبەستەکەت ڕوون بێت، ئیدی دروشم پێویستییە، بانگەشەییە، با دروشمت ڕیگایی مەبەستت بێت، لە نێو دێڕێکدا. (بە ئاگابن بەهۆیی لاوازیی لە ناونانی پڕۆژەکان لە کوردا، زۆر کات و هەموو کات بەداخەوە، دروشم، دروشمی پڕۆژەکان دەکەنە ناو، ئێمە کە ناڵیین خراپە شتی وا، دەڵیین کە باشترە ناو، ناو بێت, وە دروشم کاریی ناو بێت)
* میکانیزمی کارکردنی چۆن بێت و چۆن بۆ خۆمانی دیاریی بکەین؟
کاریی سەرکەوتوو هەمیشە ئەو کارەییە، کە ڕێڕەویی خۆیی گرتووە، بە جۆرێک بە لایەکدا دەڕوا، هاکەزایی نییە و ڕێکخراوە، ئێوەش هەر کاتێک پلانتان دانا بۆ پڕۆژەکەتان بۆیی کە چۆن و بە چی میکانیزمێک کاریی خۆیی بکات، هەوڵ بدەن، کاریی بۆ بکەن، با کارتان لەسەر یەک ڕێڕەو بێت، خەڵکی فێر بکەن، بەوەیی کارەکەتان چۆنییە، خەڵکی بە جۆرێک لە جۆرەکان

ئالودەی شێوە ڕێکخراوەیی کاری خۆتان بکەن، ئەوەیی کارتان دەبینێ با بەشێوە کاردنتان فێر بێ، بەوەیی بزانێ چۆن و چۆنهان، تا هۆگر بە پڕۆژەتان بێت.

* جیاوازی پڕۆژەکە لە چیدا دەبێ، چی تێدایيە کە نەکرابێ؟

چاوێک بە تەواویی بە ئەوە بخشێنەوە کە تۆ چی دەکەیی، ئاخۆ ئەوەیی تۆ دەیکەیی لە کوامە خاڵ، لە کوامە ڕوانگە، لە کوامە بینین، جیاوازی هەیە، لە کوێدایيە ئەوەیی کە ئەتوانێ جێگرەوەیی نەبێ، یانیش ئەوە چییە؟ پڕۆژەیی تۆی جیاواز کردووە لەوانی دیکەو دەکرێ بڵێین ئا ئەمەییە جیاوازی، ئا ئەمەییە کە دەتوانێت منێک، تۆییەک بخاتە ئەو بیرەیی کە بۆ جاریی دووەم بێت و پڕۆژەکە وەک تاقیکردنەوە نا بەڵکو وەک کەسێک کە هۆگریی بووە، بەوەیی وەک پێویستیەک لێی ئەڕوانێ، پڕۆژەکەت بەکاربێنێت.

* چییە خاڵی کۆڵنەدان و پێ گرتنی پڕۆژەکە؟

ئەگەر تۆ بەتەمایی ئەمڕۆکە پڕۆژەکەت ڕابگەیەنی و بەیانی ببێتە پێشەنگ و یەکەم، ئەوا باشترە، زۆر باشترە، هەر زوو دەست هەڵبگریی لەوەیی ئەیکەیی، لەوەیی پلانت بۆداناوە، ئاخر پڕۆژەیەکی سەرکەتوو،

بنەمایی کارکردنی دەبێ بەردەوامبوون بێت، بە بنەمایی بینینی خۆیی بۆ پڕۆژەکەیی لە بەردەوامبوونی بۆ لانی کەم زۆرتر لە چەند ساڵێک. هەموو کات، بنەمایی بیرتان، فیکرتان، لەسەر ئەوە بنیادبنێین، ئەوەیی ئێوە دەیکەن، کاریی بۆ بکەن لەوەیی کە مەودایی مانەوەیی زۆر درێژە بکێشێ، ئاخر ئەگەر لەسەر ئەو بنەماییە کارتان داڕێژن کە وتم توشی ئەوە نابن کە لە مانگی یەکەمی کارتان پڕۆژەتان دابخەن.